بسم الله الرحمان الرحيم

هەرگیز مەوەستە لە بەخشینی ئەو شتەی دەیزانیت

چونکە بەیانی دەچیتە ژێر گڵەوە هیچت بۆ نامێنێتەوە

جگە لەوەی بەخشیووتە لەدوای مردن بۆت ئەمێنێتەوە

# فێربونی مایکرۆسۆفت ئێکسڵ 2010

---

نووسەر- هەردی کانبی

ناوی کتێب – فێربونی مایکرۆسۆفت ئێکسڵ 2010

نووسـەر – هەردی کانبی احمد

دەربارەی – بەرنامەی مایکرسۆفت ئێکسڵ

ساڵ – هاوینی 2013

ئەم کتێبە پێشکەشە بە هەموو هاوڕێیانم

هەموو ئەو هاوڕێیانەی کە لێم دوورن وە ئەو

هاوڕێیانەی کە من جێم هێشتوون و وە ئەو

هاوڕێیانەی منیان جێ هێشتووە وە پێشکەشە

بە هەموو فێرخوازانەی کە ئارەزو مەندن فێری

ئەم بەرنامەیە ببن.

نووســـەر : هەردی کانبی

زانکۆی سلێمانی – بەشی ژمێریاری

قۆناغی یەکەم

# پێشەکی:-

**سەرەتا بەناوی خودای گەورەو میهرەبان بۆ من دڵ خۆشیەکی زۆرە کە خودای میهرەبان دەرفەت و توانای بەخشیە من کە بتوانم کتێبێکتان بۆ ئامادە بکەم بۆ هەموو ئارەزو مەندانی زانستی کۆمپیتەر کە هیوادارم سوود لەم کتێبە وەربگرن وە هەروەها ببیتە هۆی دەوڵەمەن کردنی کتێبخانەی کوردی لە بواری کۆمپیتەردا وە هیوادارم هەموو ئەو کەسانەی کە ئارەزو مەندن فێری ئەم بەرنامەیە ببن سوود لەم کتێبە وەربگرن.**

**وە ئەم کتێبە پێشکەشە بە هەموو کەسێک و بە بێ بەرامبەرە بۆ هیچ کەسێک نیە چاپی بکات، بۆ ئەوەی هەموو کەسێک سوودی لێوەربگرێت.**

**(لە کەموو کوریو هەڵەکانم ببورن)**

# ...ناوەڕۆک...


| بـــــابـــــەت | لاپــەڕە |
|---|---|
| روکاری بەرنامەکە | 6 تـا 7 |
| ....بەشی یەکەم.... | |
| باسکردنی لیستی(File) | 8 |
| باسکردنی لیستی(Home) | 9 تـا 25 |
| باسکردنی بەشی(Format Cells)یەکەم(Number) | 26 تـا 31 |
| باسکردنی بەشی(Format Cells)دووەم(Alignment) | 32 تـا 34 |
| باسکردنی بەشی(Format Cells)سێیەم (Font) | 35 تـا 38 |
| باسکردنی بەشی(Format Cells)چوارەم(Border) | 39 تـا 40 |
| باسکردنی بەشی(Format Cells)پێنجەم(Fill) | 41 تـا 44 |
| باسکردنی لیستی(Insert) | 45 تـا 59 |
| باسکردنی لیستی (Format) | 60 تـا 63 |
| باسکردنی لیستی(Page Layout) | 64 تـا 68 |
| باسکردنی بەشی (Data Validation) | 69 تـا 75 |

| | |
|---|---|
| 76 تــا 77 | دروست کردنی لیست(Tab) |
| 78 تــا 81 | پرینت کردن(Print) |
| 82 تــا 83 | خەزن کردن (Save) |
| | ....بەشی دووەم.... |
| 84 | کردارە بیرکاریەکان |
| 85 | ریزبەندی کردارە بیرکاریەکان |
| 86 تــا 87 | جۆری کردارە بیرکاریەکان |
| 90 تــا 91 | بەکارهێنانی نیشانەی ($)لە کردارە بیرکاریەکاندا |
| | ....بەشی سێیەم.... |
| 92 تــا 94 | فەکشن چیەوچۆن بیهێنینە ناو بەرنامەکە |
| 95 | فەکشنی (SUM) |
| 96 | فەکشنی (AVERAGE) |
| 97 | فەکشنی (MAX) |
| 98 | فەکشنی (MIN) |

| | |
|---|---|
| فەکشنی (COUNT) | 99 |
| فەکشنی (IF) | 100 تـــا 102 |
| فەکشنی (AND)&(OR) | 103 تـــا 104 |
| فەکشنی (IF)&(AND) | 105 تـــا 106 |
| فەکشنی (SUM IF) | 107 تـــا 108 |
| فەکشنی (COUNT IF) | 109 تـــا 110 |
| فەکشنی(NOW)&(TODAY) | 111 |
| کـــــۆتـــای | 112 |

# چۆنیەتی گەیشتن بەبەرنامەکە :–

Microsoft Excell 2010<=Microsoft office<=All program <=Start

**ئەمە روکاری بەرنامەکەیە کە دەکرێتەوە:**



# روکاری بەرنامەکە

ئەم بەرنامەیە لە (1717960704) خانە پێک هاتووە ئەم خانانەش لە یەگرتنی (کۆڵۆم) و (ڕۆیەکان) پێکدێت.

کۆڵۆمەکان ژمارەیان (16384) دانەیمە ئەم کۆڵۆمانەش ناونراون بە حەرفی ئینگلیزین(A,B,C,D,F,G,H,I,J,...) .

ڕۆیەکان ژمارەیان (1048576) دانەیە ئەم ڕۆیانەش ناونراون بە ژمـارەکان (1,2,3,4,5,6,7,8,9)

لە بەشی سەرەوەی Name Box هەیە کە لێرەدا کلیک لە هەر خانەیەک بکەین ڕاستەوخۆ لێرەدا ناوەکەی دەنوسێت ناونانی خانەکانیش بە حەرفی (کۆڵۆم) وە ژمارەی(ڕۆیەکان) دەنوسرێت .

بەرنامەکە لە سێ (Sheet) پێک هاتووە کە ئێمە دەتوانین ئەم شیتانە زیادبکەین.

## بەشی یەکەم

## باسکردنی لیستەکان

## لیستیFile

ئەم لیستە لەم بەشانەی خوارە پێکدێت :-

save/1 : بە کاردێت بۆ پاشەکەوت کردنی داتاکان.

Save as/2 : بەکاردێت بۆ پاشەکەوت کردنی داتاکان دووبارە بەناوێکیتریان بەشێوازێکی تر.

open/3 : بەکاردێت بۆ کردنەوەی فایلێکی خەزن کراو.

New/4 : بە کاردێت بۆ کردنەوەی پەرەیەکی تازە بەم هەنگاوانە:

(New => blanck workbook => create) .

close/5 : بەکاردێت بۆ داخستنی روکاری بەرنامەکە.

information/6 : لێرەدا زانیاریمان دەداتێ دەربارەی بەرنامەکە.

Recent/7 :لێرەدا هەموو ئەو پرۆژانە دەبینین کە لەوەو پێش پاشەکەوتمان کردوە.

print/8 : بەکاردێت بۆ خستنە سەر لاپەرەی داتاکانمان.

Help/9 : بەکاردێت بۆ زانیاری زیاترو پشتیوانی لەسەر بەرنامەکە.

Exit/10 : بەکاردێت بۆ چونەدەرەوە لە بەرنامەکە.

# لیستیHome

ئەم لیستە لە م بەشانەی خوارەوە پێکدێت

## یەکەم :– Clipbord

ئەم بەشە لەم ئایکۆنانە پێکدێت



1/copy : بەکاردێت بۆ لەبەرگرتنەوەی نوسین.



2/cut : بەکاردێت بۆ هەڵگرتنی نوسین لە شوێنێک بۆ شوێنێکیتر.



3/paste : بەکاردێت بۆ دانانی نوسین.



4/Format paiter: بەکاردێت بۆ گواسنەوەی فۆرمات لە نێوان خانەکاندا.

**سەرنج**

فۆرمات واتە جۆری فۆنت و رەنگی فۆنت و رەنگی پشتەوە و هەموو ئەو شتانەی پەیوەندی بە خانە کەوە هەیە.

## دووەم :– Font

**ئەم بەشە لەم ئایکۆنانە پێکدێت**




**Font/1 : بەکاردێت بۆ دیـاری کردنــی جۆری فۆنتەکە.**




**Font size/2 : بەکاردێت بۆ دیاریکردنی قەبارەی فۆنتەکە.**



**Font color/3 : بەکاردێت بۆ گۆریـنی رەنگـی فۆنت.**



**Fill color /4 : بەکاردێت بۆ گۆرینی رەنگی پشتەوەی خانەکان.**



**Increase Font size/5 : بەکاردێت بۆ گەورەکردنی قەبارەی فۆنت.**



**Decrease Font size/6 : بەکاردێت بۆ بچوک کردنی قەبارەی فۆنت.**



**Bottom Border/ 7 : بەکاردێت بۆ دروست کردنی چوارچێوە بۆخانەکان .**



## سێیەم :- Alignment

**ئەم بەشە لەم ئایکۆنانە پێکدێت**


1 /Top Align : **بەکاردێت بۆ گواستنەوەی نوسین بۆ بەشی سەرەوەی خانەکە.**


BottomAlign/2**: بەکاردێت بۆ گواسنەوەی نوسین بۆ بەشی خوارەوەی خانەکە.**


Middle Align/3**: بەکاردێت بۆ گواسنەوەی نوسین بۆ بەشی ناوەراستی خانەکە.**


4/ Align Text to left **: بەکاردیت بۆ گواسنەوەی نوسین بۆ لای چەپی خانەکە.**


Align Text to Right/5**: بەکاردێت بۆ گواستنەوە نوسین بۆ لای راستی خانەکە.**


Center/6 **: بەکاردیت بۆ گواستنەوە نوسین بۆ ناوەراستی خانەکە.**





Orintation/7 : بەکاردیت بۆ گۆرینی شێوازی نوسین .

نوسینەکە لەسەرەوە بۆ خوارەوە بێت یان لە خوارەوە بۆ سەرەوە بێت یان لار کردنەوەی نوسین بە چەند گۆشەیەک.



/8 Left to Right Text : بەکاردیت بۆ دیاری کردنی شوێنی نوسین

دەسپێکردنی لە لای راست یان لەلای چەپ یان لە هەردولاوە.




/9 Wrap Text : بەکاردێت بۆ نوسینی چەند دێرێک لە خانە یەکدا.




Merge& Center/10 : بەکاردێت بۆ لێکدانی چەند خانەیەک واتە چەند خانە یەک دەکەین بە یەک خانە.



## چوارەم :- Number

**ئەم بەشە لەم ئایکۆنانە پیکدێت**




**Number format/1 : لەم بەشەدا خانەکە تایبەت مەند دەکەین بەوەی که تەنها ژمارە یان کات یان بەروار یان هەرشتێک که بمانەوێت تیا داخڵ بکرێت.**



**2/ Accounting Number format : بەکاردێت بۆ دانانی نیشانەی پارە(عمولة) بۆ خانەکان وەک نیشانەی ($،€،£،Ç).**



**Percent style/3 : بەکاردێت بۆ نوسینی ڕێژەی سەدی لەخانەکاندا (%)**



**Comma style/4 : به کاردێت بۆ دانای فاریزە بۆ ژمارەکان کە لەبەینی هەر سێ ژمارە دا خۆی فاریزەیەک دادەنێت (1،000،000،000)**



**5/ Increase Dicemal : بەکاردێت بۆ زیاد کردنی (سفر)لە دوای فاریزە.**



**Decease Dicemal/6 : بەکاردێت بۆ کەم کردنەوەی (سفر)لە دوای فاریزە.**



# پێنجەم :- Styles

ئەم بەشە لەم ئایکۆنانە پێکدێت:-




Format as table/1: لەم بەشەدا دەتوانین شێوازی جۆراوجۆر بۆ خشتەکەمان دابنێین کە پاشان باسی دروست کردنی خشتە دەکەین.




Cell styles /2: لەم بەشەدا دەتوانین چەندشێوازێکی جیاوازبدەین بەخانەکان.




Counditional formating/3 : ئەم بەشە گرنگیەکی زۆری هەیە لە بەرنامەکە کەدا چونکە دەتوانین بە هۆی ئەم بەشەوە رەنگی فۆنت رەنگی پشتەوە شێوازی چوارچێوەی خانەکەو زۆرشتیش بگۆرین بە پێی ئەو مەرجەی خۆمان بۆی دادەنێین.






## باسکردنی بەشی Counditinal formatting: –

**لەم شێوازانەی خوارەوە پێکدێت :–**

1/Hilghtghtin cells Rules :–

**لەم بەشەدا ئێمە خۆمان مەرج بۆ خانەکە دادەنێین کە ئەم خانەیە گەورەتر یان بچوکتر یان یەکسان بێت بە ژمارەیەک ئەوا ئەگەر مەرجەکە هاتە دی ئەوا رەنگی فۆنتەکە یان رەنگی پشتەوەی خانەکە یان رەنگی چوارچێوەکەی بگۆرێت.**




**لێرەدا ئێمە نوسیومانە هەرژمارەیەک بچوکتر بوو لە (50) ئەوا با باگراوندی پشتی خانەکە( سوور) بیت.**

**وەک لە وێنەکەدا دیارە دەتوانی ژمارەکە بگۆرین وە لەبەشی لای راستیش شێوازەکە بگۆرین بە رەنگی فۆنت یان رەنگی چوارچێوەی خانەکە یان گۆرانکاری لە رەنگەکاندا بکەین.**

– : Data bars /2

**لەم بەشەدا خۆی بە پێی ریزبەندی لە گەورەوە بۆ بچوک رێژەی خانەکە پر دەبێتەوە.**



| | |
|---|---|
| 45 | 20 |
| 46 | 30 |
| 77 | 12 |
| 89 | 11 |
| 12 | 98 |
| 19 | 185 |
| 10 | 87 |
| 99 | 98 |
| 10 | 70 |

– : Color scales/3

**لەم بەشەدا راستەوخۆ خانەکان بەچەند رەنگێکی جیاواز رەنگ دەکات.**



| | |
|---|---|
| 45 | 20 |
| 46 | 30 |
| 77 | 12 |
| 89 | 11 |
| 12 | 98 |
| 19 | 185 |
| 10 | 87 |
| 99 | 98 |
| 10 | 70 |

**– : Icon sets/4**

**لەم بەشەدا چەند ئایکۆنێکی جوان ئامادەکراوە کەدەتوانین راستەوخۆ بۆ خانەکان مانی دابنێین.**



| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 10 | 1 | 10 | 1 | 10 |
| 2 | 20 | 2 | 20 | 2 | 20 |
| 3 | 30 | 3 | 30 | 3 | 30 |
| 4 | 40 | 4 | 40 | 4 | 40 |
| 5 | 50 | 5 | 50 | 5 | 50 |



| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 10 | 1 | 10 | 1 | 10 |
| 2 | 20 | 2 | 20 | 2 | 20 |
| 3 | 30 | 3 | 30 | 3 | 30 |
| 4 | 40 | 4 | 40 | 4 | 40 |
| 5 | 50 | 5 | 50 | 5 | 50 |

**لەگەڵ چەند شێوازێکیتردا کە دەتوانین وەک ئەم نمونانەی سەرەوە تاقیان بکەینەوە.**

– : New Rule/5

**لەم بەشەدا ئێمە خۆمان دەتوانین فۆرماتین دروست بکەین بەچەند شێوەیەکی جیاواز .**




– : Clear Rule/6

**ئەم بەشە بەکاردێت بۆ لابردنی ئەو شێوازانەی سەرەوا کە باسمان کرد واتا گێرانەوەی خانەکە بۆ باری ئاسای.**



## شەشەم : Cells

**ئەم بەشە لەم ئایکۆنانە پێکدێت:-**




**Insert/1 :- ئەم ئایکۆنە واتە زیاد کردن کە ئە ویش چوارجۆرە :**

**A – Insert cell :- بەکاردێت بۆ زیاد کردنی خانەیەک.**

**B – Insert sheet colums :- بەکاردێت بۆ زیادکردنی(Colom)**

**C – Insert sheet Rows : – بەکاردێت بۆ زیاد کردنی(Row)**

**D – Insert sheet : – بەکاردیت بۆ زیادکردنی (Sheet)**




**Delete/2 :- ئەم ئایکۆنە واتە سڕینەوە ئەویش چوارجۆرە :**

**A– Delete cell :- بەکاردێت بۆ سڕینەوەی خانەیەک.**

**B – Delete sheet colums :- بەکاردێت بۆ سڕینەوەی (collom).**

**C – Delete sheet Rows :- بەکاردێت بۆ سڕینەوەی(Row).**

**D– Delete sheet :- بەکاردێت بۆ سڕینەوەی(sheet).**




**Format/3 :– ئەم ئایکۆنە لەم بەشانە پێکدێت**

**Row height –A :– بەکاردێت بۆ گۆرینی بەرزی (Row) .**

**Colum width –B :– بەکاردێت بۆ گۆرینی پانی (colum) .**

**Hide &Unhide –C :– بەکاردێت بۆ شاردنەوەو پیشاندان.**

**(Hide Row,Hide colum,Hide sheet)(Unhide Row, Unhide coulm)**

**Rename sheet –D :– بەکاردێت بۆ گۆرینی ناوی (sheet) .**

**Tab color –G :– بەکاردیت بۆ گۆرینی رەنگی (sheet).**






## حەوتەم :- Editing

**ئەم بەشە لەم ئایکۆنانە پێکدێت:-**




**Auto sum/1 :- کەلێرەدا 5 فەکشنی تیایە ئەم فەکشنانە ناسراون**

**بە فەکشنەکانی(Auto sum) کە لە دوایدا باسیان دەکەین.**




**Clear/2 :- ئەم ئایکۆنە واتە پاکردنەوە (سڕینەوە)ی خانەکان کە**

**ئەمیش لەم بەشانە پێکدیت.**

**A– Clear format :– بە کاردێت بۆ سڕینەوەی فۆرماتی خانەکان.**

**فۆرمات واتە (رەنگی فۆنت ، قەبارەی فۆنت،جۆری فۆنت ،......هتد).**

**B– Clear contents:– بەکاردێت بۆ سڕینەوەی نوسینی ناوخانەکان.**

**C– Clear coments:– بەکاردێت بۆسڕینەوەی کۆمێنتی خانەکان.**

**D– Clear Hyperlinks:– بەکاردێت بۆ سڕینەوەی ئەو لینکانەی دا.**

**مان ناوە لەسەر خانەکان.**

**E– Clear All :– بەکاردێت بۆ سڕینەوەی ئەو بەشانەی پێشەوە کە**

**باسمان کرد هەمووی بەیەکەوە.**




**3/ Sort & filter :–**

**ئەم ئایکۆنە لەم بەشانە پێکدێت**

**A– Sort A to Z : بەکاردێت بۆریزکرنی خانەکان بە پێی حەرفی ئەبجەدی لە (A) بۆ (Z).**

**B– Sort Z to A : بەکاردیت بۆ ریزکردنی خانەکان بە پێی حەرفی ئەبجەدی لە (Z)بۆ (A).**






## –: Filter –C

**ئەم ئایکۆنە واتە جیاکردنەوە (پاڵاوتن)، جیا کردنەوەی زانیاریەک لە نێوان کۆمەڵێک زانیاریدا.**

| ID | name | age | phone |
|---|---|---|---|
| 1 | hardy | 17 | 770 |
| 2 | akam | 18 | 750 |

| ID | name | age | phone |
|---|---|---|---|
| 1 | hardy | 17 | 770 |
| 2 | akam | 18 | 750 |
| 3 | ari | 19 | 770 |
| 4 | azad | 13 | 750 |
| 5 | ahmad | 12 | 770 |
| 6 | shwan | 19 | 750 |
| 7 | sheren | 22 | 770 |

### سەرنج

**ئەگەر کلیک لەو ئایکۆنەی سەر خانەکان بکەین کەدیارە لە وێنەکادا بۆکسێک دەکرێتەوە ئەو کۆلۆمە تاخوارەوە چی تێدابێت پیشانی ئەیات ، ئێمەش دەتوانین، چیمان بوێت نیشانەی (راستی) لێبدەین و بەس ئەوەمان پیشانبدات ئەوانەی تر بشارێتەوە.**




## 4/Find & slecet :–

**ئەم ئایکۆنە لەم بەشانە پێکدێت :–**

A– Find :– **بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی تێکستێک (نوسین) لەناو بەرنامەکەدا.**




B – Replace : – **بەکاردێت بۆ گۆڕینی نوسینێک بە نوسینێک ی تر.**



**C– Formulas :– بەکاردێت بۆ دۆزینەوی (fuction) لە ناوبەرنامەکەدا چی خانەیەک فەکشنی تیا داخڵ کرابێت راستەوخۆ دیاری دەکات بۆمان.**

**D– Comments :– بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی کۆمێنت لەناو بەرنامەکەدا هەرخانەیەک کۆمێنتێکی لەسەر نوسرابێت راستەوخۆ دیاری دەکات.**

**E– Counditional formating :– بە کاردێت بۆ دۆزینەوەی ئە خانانەی (Counditional formatting) لە سەرە.**

**F– Data validation :– بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی ئەوخانانەی (Data validation) لەسەرە.**

**سەرنج**

**لە دوایدا باسی (Comment) و (Data validation) دەکەین.**

## Format Cells

**ئەم بەشە بەشێکی گرنگە لە بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئێکسڵ دا چونکە لەم بەشەدا دەتوانین گۆرانکاری لە هەموو تایبەتمەندیەکانی خانەکان بکەین.**

**ئەم بەشە لە شەشەش (6) بەشی جیاواز پێکدێت:-**

## یەکەم : Number :-

**لەم بەشەدا خانەکە تایبەت مەند دەکەین بەوەی کە ژمارە یان کات یان بەروار یان پارە (عوملە) ،...... یان هەنێ شتی تری تیا داخڵ بکرێت.**

**ئەم بەشە پێکدێت لەم شێوازانە :-**



A– General :– ئەم بەشە واتە گشتی (عام) واتە دەتوانین لە خانەکەدا هەموو جۆرە داتایەک داخڵ بکەین.

B– Number:–لەم بەشەدا خانەکە تایبەت مەند دەکەین بەوەی ئەگەرژمارە مان داخڵکرد ئەوا خۆی راستەوخۆ لەبەینی هەر سێ (3) ژمارە دا فاریزە مان بۆ دادەنێت. وە دەتوانین (سفر) لە دوای فاریزەوە زیاد بکەین.



**C– Currency :– ئەم بەشە بەکاردێت بۆ دانانی نیشانەی پارە(عملە)کەنیشانە ی (عملە) زۆربەی وڵاتەکانی تێدایە.**



Date –D :– لێرەدا خانەکە تایبەت مەند دەکەین بەوەی بەرواری تێدا داخڵ بکرێت.



**E– Time :– لێرەدا خانەکە تایبەت مەند دەکەین بە داخڵ کردنی کات**

**ئەگەر هەر ژمارەیەک داخڵ بکەین بەشێوەی کات دەی نوسێت.**



F – Percentage :– بەکاردێت بۆ دانانی نیشانەی ڕێژەی سەدی (%) بۆ خانەکان.



## دووەم : Alignment :-

**ئەم بەشە تایبەتە بە نوسین (Text)لە ناو خانەکان و وە چۆنیەتی نوسین و شێوازە کانی.**



**A– Orientation :– ئەم بەشە دە کەوێتە لای راستی ئەو لاپەرەی بۆ مان دەکرێتەوە و بەکاردێت بۆ لارکردنەوەی نوسین بە چەند گۆ شەیەکی جیاواز بە ئارەزوی خۆمان.**






**B– Text Alignment:– ئەم بە شە تایبەتە بە گۆرینی شوێنی نوسینەکان کە ئەویش دوو شێوازە :–**

1– Vertical **:– بەکاردێت بۆ گۆرینی شوێنی نوسین بەشێوەی ئاسۆی واتە نوسینەکە لە سەرەوە یان لە خوارەوە یان لە ناوراست دا بێت.**

2–Horizontal **:– بەکاردێت بۆ گۆرینی شوێنی نوسین بەشێوەی ستونی واتە نوسینەکە لای راست بێت یان لای چەپ یان لە ناوەراست بێت.**



**سێیەم : Font :– ئەم بەشە تایبەتە بە فۆنــت و ئەو گۆڕانکاریانەی پەیوەند یان بە فۆنتەوە هەیە.**



A– Font :– بەکاردێت بۆ دیاری کردنی جۆری فۆنت.




B– Font style :– بەکاردێت بۆدیاریکردنی شێوازی فۆنتەکە کەئەویش چوار جۆرە :–

1/ Regular :– نوسینەکە شێوازێکی سادە وەردەگرێت.

2/Italic :– نوسینەکە شێوازێکی لار وەردەگرێت.

3/Bold :– نوسینەکە شێوازێکی تۆخ وەردەگرێت.

4/Bold Italic:– نوسینەکە شێزازێکی تۆخ و لار وەردەگرێت.



**C– Font size :– بەکاردێت بۆ گۆرینی قەبارەی فۆنتەکە.**




**D– Underline :– بەکاردێت بۆ کێشانی هێڵ لەژێر نوسین دا.**

**E– Color :– بەکاردێت بۆ گۆرینی رەنگی نوسینەکە.**

**F–Normal Font :– بەکاردێت بۆ هەڵبژاردنی فۆنتێکی سادە.**



G– previwe : لێرەدا هەرجۆرە فۆنتێک و هەر شێوازێک هەڵبژێرین نمونەکە ی مان پیشاندەدات.




H– Effects : لێرەدا دەتوانین چەند شێوازێکی تایبەت بدەین بەنوسینەکانمان وەک (هێڵ بەسەرداهێنان و بردنە پشتەوەی نوسینەکان)



**چوارەم/Border :-** لەم بەشەدا دەتوانین چوارچێوە بۆ خانەکان دروست بکەین بە چەندان شێوازی جیاواز.



A– Style :– لێرەدا شێوازی ئەو هێڵە هەڵدەبژێرین کە دەمانەوێت.

B– Color :– لێرەدا رەنگی هێڵەکەمان دەگۆرین بە ئارەزوی خۆمان.




C– Border :– لێرەدا چوارچێوەکە دروست دەکەین بە ئارەزوی خۆمان.



**پێنجەم : Fill :- بەکاردێت بۆ گۆرینی رەنگی پشتەوەی خانەکان.**



A– Backcolor :– لێرەدا رەنگێک هەڵدەبژێرین لەورەنگانەی کە دیاری کراوە بۆ پشتەوەی خانەکانمان.




بۆ رەنگی زیاتر کە لەناو ئەم کۆمەڵە رەنگەدا نیە کلیک لە (More colors)

B– Patten style :– لێرەدا چەند شێوازێک لە هێڵ هەیە کەدەتوانین دایان بنێین بۆخانەکان.

C– Patten color :– لێرەدا دەتوانین رەنگی ئەو هێڵانە بگۆرین کە لە پێشتر دامان نابوو.






D– Sample :– لێرەدا نمونەی ئەو ڕەنگەمان پیشاندەدات کە هەڵی دەبژێرین.



**ئەمەش نموونەیەک لەسەر دروست کردنی خشتەو گۆرینی باگراووندی پشتەوەی خانەکان.**




**.....بە هیوای سوودمە ندبوون....**

**.....بە هیوای سوودمە ندبوون....**

.....بە هیوای سوودمە ندبوون....

# لیستی:Insert

**ئەم لیستە واتە هێنان واتە هێنانی چەند كۆمەڵە شتێک و زیاتكردنیان بۆ روكاری بەرنامەكە.**

**ئەم لیستە لەم بەشانەی خوارەوە پێكدێت :-**

## یەكەم : Table




**1/ Table :- بەكاردێت بۆدروست كردنی خشتە لە سەر روكاری بەرنامەكە.**



| Column1 | Column2 | Column3 | Column4 | Column5 |
|---|---|---|---|---|

**سەرنج**

**سەرەتا خانەكان دیاری دەكەین و پاشان كلیک لە ئایكۆنی (Table) دەكەین خشتەیەكمان بۆ دروست دەبێت وەک لەوێنەكەدا دیارەو دەتوانین داتای تێدا داخڵ بكەین.**

## دووەم : illustratrations :– ئەم بەشە لەم ئایکۆنانەی خوارەوە پێکدێت







1–picture :– بەکاردێت بۆ هێنانی وێنە بۆناوبەرنامەکە.






**Shapes –2 :– بەکاردێت بۆ هێنانی کۆمەڵێک شێوەی ئەندازەی ئامادەکراو بۆناو بەرنامەکە.**




**لە گەڵ کۆمەڵێک شێوەی ئەندازەی تر کە ئامادەکراون و دەتوانین بەکاریان بهێنین و وە نوسینیشیان لەسەر بنوسین.**




**3– Smart Art :– لەم بەشەدا کۆمەڵێک شێوازی ئەندازەی نایابی تێدایەکە دەتوانین بیهێنینە سەر روکاری بەرنامەکەو نوسینیان لەسەر بنوسین.**




**.....سوودمەندبونتان ئامانجمانە......**

**....سوودمەندبونتان ئامانجمانە....**

**....سوودمەندبونتان ئامانجمانە....**




Screenshot/4 : ئەم بەشەبەکاردێت بۆ وێنەگرتنی سەرشاشەی کۆمپیتەرەکەمان و هێنانی راستەوخۆی وێنەکە بۆناو بەرنامەکە.



**سێیەم : Charts :- لەم بەشەدا دەتوانین ئە داتایانەی هەمانە بە وێنە بینوێنین.**

**لەم بەشەدا کۆمەڵێک (Chart) ئامادەکراو هەیە کەدەتوانین راستەوخۆ بەکاریان بهێنین.**




**وەک لەوێنەکەشدا دیارە لەم بەشەدا چەند کۆمەڵێک (Chart) جیاواز هەیە لەروی شێوەوە دیزاینەکانیان. بۆیە لێرەدا جیاکراونەتەوە بۆ ئەم بەشانە:-**




**1/ Column : لێرەدا هەموو ئە و (Chart) تیایە کە لەسەرشێوازی درێژین.**






**Line/2 :– لێرەدا هەموو ئەو (Chart) تیایە کە لەسەرشێوەی هێڵن.**

| | | |
|---|---|---|
| 12 | 13 | 13 |
| 23 | 21 | 5 |
| 34 | 29 | -3 |
| 45 | 37 | -11 |
| 56 | 45 | -19 |
| 67 | 53 | -27 |




**سەرنج**

**ئەگەر سەیری وێنەکە بکەین لە 3 هێڵ پێکهاتووە چونکە لەو خشتەیەی ئێمەدا3(Colom) هەیە وە ریزبەندیەکەش لەخوارەوەی وێنەکەدا دیارەلە 1 تا 6 چونکە لە خشتەکی ئێمەدا 6(Row)هەیە.**




**Pie/3 :- ئەم کۆمەڵە (Chart)لێرەدان هەمویان لەسەر شێوەی بازنەین.**

| | | | |
|---|---|---|---|
| 1 | 50 | 22 | 12 |
| 2 | 21 | 24 | 16 |
| 3 | 22 | 26 | 20 |
| 4 | 23 | 28 | 24 |
| 5 | 24 | 30 | 28 |
| 6 | 25 | 32 | 32 |




**سەرنج**

**ئەگەر سەیری وێنەکە بکەین لە شەش (6) رەنگی جیاواز پێک هاتووە چونکە لەخشتەکەی ئێمەدا شەش (6) (Row)هەیەرەنگە (شینەکەش)لەوێنەکەدا رووبەرە**

**کەی لەهەموو رەنگەکان گەورەترە چونکە لە ریزی یەکەمدا کە بە رەنگە شینەکە دیاری کراوە ئەو ژمارەنەی تێداداخڵ کراوە لە هەموو ریزەکانی تر زیاترە.**




## 4/ Bar :– ئەم کۆمەڵە (Chart) لەم بەشەدان شێوەیەکی لاریان هەیە.

| | | |
|---|---|---|
| 50 | 22 | 12 |
| 21 | 24 | 16 |
| 22 | 26 | 20 |
| 23 | 28 | 24 |
| 24 | 30 | 28 |
| 25 | 32 | 32 |




.....به هیوای سوودمه ندبوون....

.....به هیوای سوودمه ندبوون....

.....به هیوای سوودمه ندبوون....

.....به هیوای سوودمه ندبوون....




**Area /5 : ئەم کۆمەڵە (Chart)لێرەدان لەسەرشێوەی رووبەرێک دەردەکەون**



| | | |
|---|---|---|
| 23 | 12 | 21 |
| 32 | 21 | 12 |
| 41 | 30 | 3 |
| 50 | 39 | -6 |
| 59 | 48 | -15 |
| 68 | 57 | -24 |






**Scatter /6 :– ئەم کۆمەڵە (Chart) لێرەدان لەسەر شێوەی کۆمەڵێک خاڵن .**



| | | |
|---|---|---|
| 23 | 12 | 21 |
| 32 | 21 | 12 |
| 41 | 30 | 3 |
| 50 | 39 | 33 |
| 59 | 48 | 21 |
| 68 | 57 | 32 |

**سەرنج**

**خوێنەری بەرێز لەوانەیە تۆ گرنگی بەکارهێنانی (Chart) نەزانیت و پێت وابێت گرنگیەکی وای نیە ، بەڵام ئەم بەشە بە پێچەوانەوە گرنگیەکی ئەو تۆی هەیە و لە زۆر بواردا بەکار دەهێنرێت ، لەبوارەکانی (ئامارو کەش وهەوا و .....)زۆر جار لەکەناڵە تەلەڤزیۆنیەکان ئەم شێوازانە دە بینین .**

**سەرنج**

**بەرێزان ئەم کۆمەڵە شێوازی (Chart) کەباسمان کرد لە بواری بەکارهێناندا هەر بەشیکیان لە بوارێکدا بەکاردێت واتە هەر بەشێک شێوازی بەکارهێنانی خۆی هەیە ئێمە بەس باسی چۆنیەتی هێنانیمان کرد بۆناو بەرنامەکە ، بەڵام بەکارهێنەر بە پێی کارەکەی خۆی شێوازێکیان دیاری دەکات کەلەگەڵ کارەکەیدا دەگونجێت.**

## چوارەم : Text:-




**ئەم بەشە لەم شێوازانەی خوارەوە پێکدێت:-**




**1/ Text box:- ئەم بەشە بەکاردێت بۆهێنانی چوارچێوەیەک ونوسین لەناویدا**






2/Header&Footer :- بەکاردێت بۆ نوسینی تێکستێک وە دوبارەکردنەوەی لە هەموولاپەرەکانی پرۆژەکانمان بە هەمان شێوە لەبەشی سەرەوە و خوارەوەی لاپەرەکانمان.




## سەرنج

خوێنەری بەرێز ئەم بەشە گرنگیەکی باشی هەیە لە پرۆژەکاندا چونکە بەیەکجار نوسینی ئەو تێکستەی ئێمە دەمانەوێت لە هەموو لاپەرەکاندا دووبارە دەبێتەوە وەک چۆن ئەم کتێبەی کە ئێستا دەیخوێنیتەوە لە بەشی سەرەوەو خوارەوەی هەموو لاپەرەکان تێکستەکان دوبارە بونەتەوە ئەم کارە بەم بەشە کراوە.




3/ WordArt:- بەکاردێت بۆ هێنانی چوارچێوەو نوسینی تێکست تیایدا بە چەند شێوازێکی جوان.







Object/4 :- بەکاردێت بۆ هێنانی نوسراوێک لە بەرنامەیەکی ترەوە یان فایلێکی بەرنامەیەکی تر بۆ ناو بەرنامەکەو بە کلیک کردن لێی یەکسەر فایلەکە دەکرێتەوە وەک فایلی (Power point–Access–Excell–Word)






## پێنجەم :- Symbols:-

**ئەم بەشە لەم ئایکۆنانە پێکدێت.**




**1/ Equation :- لێرەدا کۆمەڵێک هاوکێشەی ماتماتیکی ئامادەکراوی تێدایە.**







**Symbol/2:- لێرەدا کۆمەڵێک هێماو نیشانەی تێدایە کەناتوانین بە کیبۆردی کۆمپیتەرەکەمان بیان نوسین**



**سەرنج**

**لەگەڵ زیادکردنی هەربەشێک لە لیستی (Insert) بۆ روکاری بەرنامەکە ئەوا راستەوخۆ لیستێکی تر زیاد دەبێت بەناوی لیستی(Format) کە لەم لیستەدا دەتوانین کۆمەڵێک گۆرانکاری لەو بەشەدا بکەین کە هێناومان جا ئەوبەشەی هێناومانە (وێنە،چارت،شێوەی ئەندازەی .......هتد) بێت**

## لیستیFormat

**سەرنج**

**ئێمە نموونەکەی وەری دەگرین لەسەر هێنانی (Shapes) بۆناو بەرنامەکە واتە بە هێنانی بەشیکی تر وەک وێنەو چارت کەمێک گۆرانکاری دروست دەبێت لە لیستی(Format)دا.**

ئەم لیستە لەم بەشانەی خوارەوە پێکدێت:-




## یەکەم :- Insert shapes :-

**ئەم بەشە بەکاردێت بۆ هێنانی شتێکی تر لەو شێوەی خۆمان هێناوومانە.**

**ئەگەر (Shapes)هێنابوو دەتوانین یەکێکیتر لێرەوە زیاد بکەین ئەگەر ( chart)**

**مان هێنابوو دەتوانین شێوازێکی تر زیاد بکەین.**

## دووەم:- Shapes style :-

**لەم بەشەدا چەند شێوازێکی جوانی تێدایە بۆ ئەو بەشەی ئێمە هێناومانە.**




## سێیەم:-Shape Fill-:




**ئەم بەشە بەکاردێت بۆ گۆرینی رەنگی پشتەوەی ئەو شێوە ئەندازەیەی هێناومانوتە سەر روکاری بەرنامەکە.**

## چوارەم :–Shape Outline:–




ئەم بەشە بەکاردێت بۆ گۆرینی رەنگی چوارچێوەی ئەو شێوازەی هێناومانەتە سەر روکاری بەرنامەکە.

## پێنجەم:– Shape Effect:–




لەم بەشەدا چەند ئیفێکتێکی جوانی تیایە بۆ ئەو شێوە ئەندازەی هێناومانەتە سەر روکاری بەرنامەکەو دەتوانین بەچەند شێوازێکی جوان بینوێنین.

## شەشەم:– WordArt style:–




لەم بەشەدا دەتوانین چەند شێوازێکی جوان هەڵبژێرین بۆ (نووسین)ی ناو ئەو شێوە ئەندازەی هەمانە..

## حەوتەم : Text Fill :–

بەکاردێت بۆ گۆرینی رەنگی ئەو نوسینەی کە ئێمە دەینوسین لەناو ئەو شیێوە ئەندازیانەی کە هێناومانەتە سەر روکاری بەرنامەکە.

## هەشتەم :Text Effect :–

بەکاردیت بۆ گۆرینی ستایلی ئەو نوسینانەی کە ئێمە دەینوسین لەناو ئەو شێوە ئەندازیانەی کە هێناومانەتە سەر روکاری بەرنامەکە.



# لیستی Page Layout

**ئەم لیستە لەم بەشانەی خوارەوە پێکدێت:-**

## یەکەم: Page setup :-

**ئەم بەشە چەند ئایکۆنێکی گرنگی تێدایە کە لە خوارەوە ئاشناتان دەکەین پێی:-**




**1/Margins : – لەم بەشەدا دەتوانین قەبارەی ئەو بەشە سپیە دیاری بکەین کە دەکەوێتە چوارچێوەی لاپەرەکەوە ئەم کردارە لەکاتی پرێنت کردندا سودی هەیە.**






**Orientation/2 :–**

**ئەم ئایکۆنە بەکاردێت بۆ گۆرینی شێوازی لاپەرەکەمان بۆ سەر باری پانی و باری درێژی لە کاتی پرێنت کردندا.**




**size/3 : –**

**لێرەدا قەبارەی ئەو لاپەرەیە دیاری دەکەین کە ئیمە دەمانەوێت زانیاریەکانی لەسەر پرێنت بکەین (A3,A4, ...هتد) لەگەڵ چەند قەبارەیەکی تر.**




**Print Area/4 :–**

**بەکاردێت بۆ پرێنت کردنی بەشێکی دیاری کراو لە پرۆژەکانمان.**




**Background/5 :–**

**لێرەدا دەتوانین باگراوندی پشتەوەی بەرنامەکەمان بگۆرین بەئارەزوی خۆمان**






## 6/ Print Title :-

ئەم ئایکۆنە گرنگیەکی زۆری هەیە ئێمە لێرەدا دەتوانین لە کاتی پرێنت کردندا یەک تایتڵ بۆ هەموو لاپەرە کانمان دابنێین.

بۆ نمونە ئێمە پرۆژەیەکمان هەیە 20 لاپەرەیە یەکجار تایتڵێک لەسەرەوەی لاپەرە یەکەم دروست دەکەین پاشان بەبەکارهێنانی ئەم ئایکۆنە بۆ هەموو لاپەرەکان دووبارەی دەکەینەوە.



## دووەم :– Sheet Options :–

**ئەم بەشە لەم ئایکۆنانە پێکدێت لەگەڵمان بن رونیان دەکەینەوە:–**

### 1/ Sheet Right–to– Left :–

**بەکاردێت بۆ گۆرینی روکاری بەرنامەکەمان لەلای راست بۆ لای چەپ وە بە پێچوانەشەوە.**



2/ Gridlines :–

لێرەدا دوو چێک بۆکس هەیە کە دەتوانین نیشانەی راستیان لێبدەین.

A/ View :– بەکاردێت بۆ شاردنەوەو پیشاندانی ئەو هێڵانەی لە ناو بەرنامەکەدا هەیە.

B/Print:– بەکاردێت بۆ شاردنەوە و پیشاندانی ئەو هێڵانە لەکاتی پرێنت کردن.

3/Headings :–

لێرەدا دوو چێک بۆکس هەیە کەدەتوانین نیشانەی راستیان لێبدەین.

A/ View :– بەکاردێت بۆ شاردنەوەو پیشاندانی ئەو ژمارەو پیتانەی کە لەسەر خانەکاندا هەیە و ناوی کۆلۆم و رۆکانی پێ دەنرێت.

B/Print :– بەکاردێت بۆ شاردنەوەو پیشاندانی ئەم ژمارەو پیتانە لەکاتی پرینت کردندا.

سەرنج

**لێرەدا ئەو لیستانەی کە ماون باسیان بکەین زۆر شتی گرنگی تێدا نیە و وە هەندێکیشیان لە پێشەوە بەسکراوە تەنها چەند شتێک نەبێت کە باسیان دەکەین لەو لیستانەی ماون ،کە بەلای ئێمەوە گرنگن و سودیان هەیە.**

## (Data validation)

**ئەم بەشە دەکەوێتە لیستی (Data) لەبەشی (Data tools).**

**ئەم بەشە گرنگیەکی زۆری هەیە چونکە دەتوانین لە ڕێگەی ئەم بەشەوە دەتوانین خانەکانمان تایبەت مەند بکەین بەوەی کە ژمارەیەک یان تێکستێک یان هەر شتێک بە ئارەزوی خۆمان بمانەوێت تیایدا داخڵ بکەین لێرەدا ئەگەر ئێمە بە پێ چەوانەی ئەم کردارە شتێکی ترمان تێدا داخڵ کرد ئەو ڕاستەوخۆ خۆی ئاگادارمان دەکاتەوە.**



## یەکەم : Settings:–

**لەم بەشەدا مەرج بۆ ئە خانەیە دادەنێن کە دەمانەوێت کە لەم بەشانە پێکدێت:–**

**Whole Number–A :– لەم بەشەدا ئەو مەرجەی دای دەنێن بۆ خانەکەمان**

**تایبەتە بەژمارە، بۆ نمونە لەم خانەیەدا تەنها ژمارەیەک دەتوانی داخڵ بکەیت کە گەورەتر بێت لە (50) یان بچوکتربێت لە (20) یان ژمارەیەک داخڵ بکرێت کە لە نێوان دوژمارەدابێت وەک لەنێوان (0) تا (10) لەگەڵ کۆمەڵێکی تر.**




### سەرنج

**لەو بەشەی سەرەوەدا دیارە ئێمە (between)مان هەڵ بژاردووە واتە ئەو ژمارەی کەلەم خانەیەدا دە توانین داخڵی بکەین دەبێت لە نێوان دوژمارەدا بێت بە ئارەزوی خۆمان وە دەتوانین بیگۆرین بە چەند شتێکی تر وەک گەورەتر یان بچوکتریان یەکسان یان یەکسان نەبێت**

**B– List :– لەم بەشەدا دەتوانین لەو خانەی کە هەمانە تەنها داتایەک داخڵ بکەین کە لەو لیستەدا هەیە کە خۆمان بۆی دیاری دەکەین.**




**واتە لەم خانەی کە ئێمە هەمانە تەنها دەتوانین ئەم ناوانە داخڵ بکەین.**

**نموونە:–**

**لە کۆلێژێک وەک زانست ئەگەر ئێمە خانەیەکمان هەبێت تایبەت بە بەشەکان دەتوانی ئێمە یەکسەر بە بەکارهێنانی ئەم بەشە بەس ناوی چوار بەشەکەی کۆلێژی زانست (کیمیا–فیزیا–بایلۆجی–جیۆلۆجی) تێدا داخڵ بکەین بۆ ئەوەی هەڵەکانیشمان کەم بێتەوە.**

**C– Date :– لەم بەشەدا دەتوانین خانەکە تایبەت بکەین بەوەی کە بەروارێکی تێدا داخڵ بکرێت کە لە نێوان دوو بەرواردابێت کە خۆمان بۆی دیاری دەکەین.**

**نموونە:– لە بەرێوبەرایەتی هاتوچۆ مۆڵەتی شۆفێری دەدەن بەو کەسانەی کە تەمەنیان لە سەرو (18) ساڵەوەیە وە بچوکترن لە (50) ساڵ بۆ ئەم مەبەستە ئێمە بەم شێوەیە خانەی تەمەن تایبەت دەکەین کە لە موالیدی (1963) تا (1995) لەو بەینەدا داخڵی دەکات ئەگەر لە موالیدە گەورەتر یان بچوکتربێت یەکسە خۆی بەرنامەکە ئاگادارمان دەکاتەوە.**



-: Time-D

**لەم بەشەش دا دەتوانین خانەکە تایبەت کەین بەوەی کە کاتێکی دیاری کراو تێدا داخڵ بکرێت بۆنمونە تەنها کاتژمێر (1) یان کاتێک داخڵ بکرێت کە لە نێوان دو کاتی جیاوازدابێت وەک لەنێوان (8)بۆ (12) لە گەڵ چەند شێوازێکی تر.**

**نموونە:- لە فەرمانگەکانی حوکمەتدا کاتی دەوام کردن لە کاتژمێر (8) دەست پێدەکات ئێمە ئەگەر پرۆژەیەکمان هەبێت، لەسەر کاتی هاتنی کارمەندان بۆ فەرمانگەو کاتی رۆشتنەوەی کارمەندەکان ئەو دەبێت ئەو خانەی کە هەمانە بۆ کاتی هاتن دەبێت یەکسانی کەین بە سەعات (8) واتە بەس سەعات (8)ی تێدا داخل دەکرێت وەلەکاتی رۆشتنەوەش لە نێوان سەعات (12) بۆ سەعات (3) دا بێت واتە تەنها کارمەند بۆی هەیە سەعات (12)و(1)و (2)و(3) بڕواتە وە.**



## E/ Text length:–

**لەم بەشەدە دەتوانین ژمارەی ئەو پیت و ژمارە و هێما یانە دیاری بکەین کە داخڵ دەکرێن لە خانەکەدا.**

**نموونە:–**

**ئەگەر ئێمە خانەیەکمان هەبێت تەمەنی کەسەکانی تێدا داخڵ بکرێت وەک خۆمان دەزانین تەمەنی کەسەکان تەقریبەن لە نێوان (1)بۆ(99) دایە بۆیە ئێمە بۆ ئەوەی لەکاتی داخڵ کردنی داتاکانمان هەڵە نەکەین ئەوا دەتوانی لە م بەشەدا دیاری بکەین کە تەنها (2) ژمارە داخڵ بکات بۆمان واتە تەمەنی هیچ کەس لە (3) ژمارە پێک نایەت ئەگەر هەڵەشمان کرد ئەوا ئاگادارمان دەکاتەوە.**



## دووەم :– Input message –:

**لەم بەشەدا ئاگادارکردنەوەیەک دەنوسین دەربارەی ئەو خانەی کە یەکێک لە بەشەکانی سەرەوەی لەسەر دائەنێن وە ئەم بەشە بەردوەام دەر ئە کەوێت.**







## سێیەم :– Error Alert –:

**لەم بەشەدا ئاگادار کردنەوەیەک دادەنێن بەڵام ئەم ئاگادار کردنەوەیە جیاوازیەکەی لەگەڵ ئەوە ی سەرەوەدا ئەوەیە ئەم ئاگادارکردنەوەیە تەنها لەکاتی هەڵەدا دەردەکەوێت کە بە پێچەوانەی ئەو مەرجەوە بێت کە بۆ خانەکەمان داناوە.**






# (دروست کردنی لیست)

**پرسیار:-** ئایا دەتوانین ئێمەش لیستێک دروست بکەین وەک لیستی(Home)و لیستەکانی تر وە چەند بەشێکی جیاوازی تێدابێت و کۆمەڵێک ئایکۆنی تێدا دابنێین کە خۆمان دەمانەوێت.

**وەڵام:-** بەڵێ ئێمەش دەتوانین لیست دروست بکەین بە ئارەزوی خۆمان بە چەند ناوێکی جیاواز کە بەو لیستە دەوترێت (Tab) وەچەند بەشێکی جیاوازی تێدابێت کە پێدەوترێت (Group) . بەم هەنگاوانەی خوارەوە:-

1/سەرەتا لەبەشی سەرەوەی بەرنامەکە لای لیستەکان کلیکی راست دەکەین.

2/ پاشان بەشی (Customize the) هەڵدەبژێرین.

3/ پاشان بەشێکی نوێمان بۆ دەکرێتەوە لە خوارەوە کلیک دەکەین لە (New Tab)

4/ پاشان لە بەشی (Rename) ناوێکی بۆ دادەنێین.

5/ بۆ دروست کردنی چەند بەشێکی جیاواز لەم لیستەدا کلیک دەکەین لە (New Group)

6/پاشان دەدەتوانین لەبەشی(Rename) ناوی (Group) بگۆرین بە ویستی خۆمان.

7/پاشان لەبەشی لای چەپ ئەو ئایکۆنەی دەمانەوێت بە کلیک کردن لە (Add) دەیهێنینە ناو لیستەکەمانەوە.

